# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين, والصلاة والسلام علــى أشــرف الأنبيــاء والمرســلين, نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين...أما بعد:

الله ﷻ ستایشی زانســت و ئەهــلەکەی کــرد کە لەگەڵ فێربونیشــیدا کــاری پــــێ دەکەن، وە پــــلەی بەرز کــــــردنەوە هەم لە دونیــــا وە هەم لە ئاخیرەتتدا هەروەک چۆن خــۆی ﷻ دەفەرموێــت : ﴿ يرْفَـعِ اللَّهُ الَّـذِينَ آمَنُـوا مِـنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ۚ ﴾ (المجادلة |11)

هەر بۆیە زانست فەزڵــی زۆرە چــرایەکە کە مــرۆڤ لە تاریکــاییەوە دەبــات بەرەو رونــــاکی، وە لە گــــومراییەوە دەیبــــاتە ســــەر رێگــــای راســــت و هیدایەت، هەروەها لەسەرگەردانیو بێ ئامــانجیەوە بــۆ رەزامەنــدی اللــە ﷻ، وە بەرزترین و چاکترین زانســت ئەوەیە کە الــلە ــــو نــاو ســیفاتە بەرزو جوانەکانیت پــێ بناســێنێت، وە مانــای خۆشەویســتی و تەوبە و پــارانەوە و متمــانە و تــرس و ئومێــد لە دڵــدا بچەســپێنێت، کە ئەمەش رۆحەکــان دڵخۆش دەکات و دڵەکــان دڵنیــا دەکــاتەوە و رەفتارەکــان باشــتر دەکــات، هەروەها رسول اللــە ش ﷺ ئەفەرموێــت ئەگەر اللــە ﷻ خێــری بوێــت بــۆ بەندەیەکی ئەوا شارەزای دەکات لە دینــدا, قــال رســول اللــە صــلى اللــه عليه وسلم: (( من يرد الله بــه خيــرا يفقــه فــي الــدين )) |متفــق عليــه|، وەک ئاشــــکرایە شــــارەزابون لە دیــــن و شــــەریعەتدا لە فێربــــونی زانستەوەیە، هەروەها بونی زانســت هۆکــارێکە بــۆ تەقــوای اللــە ﷻ وەک

چۆن ئیمام عبدالله بن المبــارك ئەڵێــت: زانــاترینی ئێــوە ئەبــێ ئەبــێ لە هەمووتان زیاتر ترس و تەقوای الــلە ـــــی هەبێــت.(أكثركم علمــا ينبغــي أن يكون أشدكم خوفا). منتدى الطريق إلى طلب العلم.

بــۆیە ئەی ئەو کەســەی کە موســوڵمانیت و خــۆت داوەتە پــاڵ ئەهلــی سوننە هەرگیز دامەبــڕێ لە عــیلم زانســتی شــەرعی هەمیشــە هەوڵــی فێربون بدە ئەگەر کەمێکیش بێت.

•بە شـــێکی زۆری قەول و ئەثەرەکـــان لەم کەنـــاڵە ئەریشـــف کـــراوەی تیلیگرام وەرگیراوە

https://t.me/Al_ajurry_1

1445-2023

١- پێشەوا الآجري - رحمــه اللــه - دەفەرمووێــت : بــزانە رەحمەتــی الــلە ـــــت لێبێــت ، مــن و تــۆ لە ســەردەمێكداین کە فیتــنە تێیــدا زۆرە لە زۆر شوێنەوە ، جا ئەگەر مرۆڤ زانستی پێ نەبێــت بــۆ ئەوەی رزگــاری بێــت و رووبەرووی ئەو فیتنانەی پــێ ببێــتەوە كە توشــی دەبــن ، ئەوا بێگومــان تێدا دەچێت .

| فرض طلب العلم للإمام الآجري |

2- هــاوەڵی بەرێــز عبداللــه ی كــوری مەســعود اللــه لێــی رازی بێــت دەفەرمووێت: فێری زانست بــبن ( زانســتی شــەرعی ) ، چــونكە بەراســتی هیچ یەكێك لە ئێوە نازانێت كەی پێویستی پێی دەبێت .

| الفوائد المنتقاة لإبن السماك |

3- هاوەڵی بەرێز أبي هريرة - الله لێی رازیبێــت - ئەڵــێ : نێــردراوی اللــه ﷺ فەرموویەتی : هەر كەســێك رێگــا بگــرێتەبەر بــۆ فێربــوونی زانســت ، ئەوا الله رێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات.

| صحيح مسلم |

“فێری زانستی شەرعیان بكەن تا مناڵیان تێپەر نەكردووە ..!"

4- قەتــادە و جــگە لەویــش وتوویــانە : فێربــوونی زانســت لە منداڵیــدا ، وەکــو نەخشــی ســەرد بەرد وایە . [ واتە ئەوەی کە حیفظــی کــردووەو فێــری بووە لەبیری دەمێنێتەوە , وەکو چۆن نەخشی سەر بەرد دەمێنێتەوە !]

| الجعديات |

" بزانە کە زانستی شەرعی لە کێ وەرئەگریت ؟! "

5- پێشەوا مالــك - رحمــه اللــه - ئەفەرمووێــت : ئەم زانســتە گۆشــت و خــوێنی تــۆیە ، دەربارەشــی لــێ پرســینەوەت لەگەڵ ئەکــرێ لە رۆژی دواییدا ، جا بروانەو بزانە لە کێی وەرئەگریت ؟!

| بغية الملتمس للعلائي |

" خێــر لەو کەســەدا نیــیە کە پشــتی کــردووە لە فێربــوونی زانســتی شەرعی ..! "

6- هاوەڵی بەرێز معاویەی کوری ئەبو ســوفیان اللــه لە خــۆی و بــاوکی رازیبێت ئەڵــێ : گــوێم لە پێغەمــبەر ﷺ بــوو دەیفەرمــوو : هەر کەســێك الله خێری بۆی بوێت ، ئەوا شارەزای دەکات لە دین ...

| صحيح البخاري وصحيح مسلم |

" فێربوونی زانست ماندوو بوونی ئەوێ "

7- یحیــــى بــــن أبــــي كثيــــر - رحمــــه اللــــه - دەفەرموویــــت : زانســــت بە ئاسودەوەییەوە بەدەست نایەت .

| صحيح مسلم |

| فێربن ! چونكە بەراستی هیچ كەسێك بە زانایی لە دایك نەبووە ...|

8- پێشەوا إبن المبارك - رحمه الله - دەفەرموێت :

سەرەتای زانست نیەتە

پاشان گوێ گرتن

پاشان تێگەیشتن لێی

پاشان لەبەركردنی

پاشان كار پێكردنی

پاشان بڵاوكردنەوەی

| جامع بيان العلم وفضله |

9- پێشــــەوا ثەوری - رحمــــه اللــــه - دەفەرموویــــت : هــــیچ كــــردەوەیەك باشتر نییە لە داواكردنی زانست ، ئەگەر بە نیەتێكی پاكەوە بێت .

[ زانست لێرەدا مەبەست لێی زانســتی شــەرعیە , نیەتیشــت لە داواكردنــی زانســت ئەم سێ خاڵەبێ :

1. جەهل و نەزانی لەسەر خۆت لا بدەیت .

2. کار بە زانستەکەت بکەیت .

3. ئامانج و مەبەستت لێی بەدەستهێنانی رەزامەندی الله بێت .]

| جامع بيان العلم وفضله |

10-هـــاوەڵی بەرێـــز عبداللـــە ــــی کـــوری مەســـعود اللـــە لێـــی رازیبێـــت فەرموویەتی : هیچ کەسێك بە زانـــایی لە دایـــك نەبـــووە ، بەڵکـــو ( بـــوون بە زانایی و ) بەدەستهێنانی زانست ، بە فێربوونە .

| المصنف للإمام إبن أبي شيبة |

11- پێشەوا أحمد - رحمه الله - دەیفەرموو :

داوای زانست دەکەم ، تا دەخرێمە گۆڕەکەم .

| شرف أصحاب الحديث |

" بەر لە هەمـــــوو شــــتێك،منداڵەکەت فێــــری تەوحیــــد و بیروبـــــاوەڕێکی دروست بکە .!"

12- پێشەوا علی کـــوری حســـین منـــداڵەکەی فێـــر دەکـــرد و پێـــی دەوت ؛ کورەکەم بڵێ : آمنت باللـــه وکفـــرت بالطـــاغوت " ئیمـــانم بە الـــلە هێنـــا و بێ باوەڕ بووم بە طاغوت.

| المصنف لإبن أبي شيبة |

13- عبدالملك الميموني - رحمه الله - دەڵێــت : أحمــد ـــــی کـــوری حنبــل - رحمه اللــه - پێــی ووتــم : ( ئاگــاداربە ) قســە مەکە لە هــیچ بابەتێکــدا ئەگەر پێشەوایەکت تێیدا نەبوو!

[ واتە قســەیەك مەکە لە هــیچ بــابەتێکی شــەرعیدا ئەگەر پــێش تــۆ هــیچ زانــایەکی ئەهلی سوننە قسەیەکی وای نەکردبوو .! ]

| مناقب الإمام أحمد |

14- پێشەوا ثەوری - رحمه الله - دەفەرموێ :

پــێم گەیشــتووەو اللــە ـــــش باشــتر دەزانــێ ، کە ســەردەمێك بەســەر خەڵکدا دێت ئەوەی فێرخوازی زانستی شــەرعی بێــت نــامۆ دەبێــت لەنــاو خەڵکدا لەو کاتەدا !

| البدع لإبن وضاح |

15- پێشـــــەوا شـــــافیعی - رحمـــــە اللـــــە - دەفەرمووێـــــت : لە دوای جێبەجێکردنی فەرزەکان هیچ شتێك بە باشــتر نزیکــت ناکــاتەوە لە اللــە عــز وجل هێندەی هەوڵدان بۆ فێربوونی زانستی شەرعی .

| طبقات الشافعية الكبرى |

16- أبو المظفر السمعاني دەڵێــت : ئەگەر راســتیت دەوێــت ، ئەوا لە کتێــبە کــۆنە کانــدا دەســتت دەکەوێــت ، ( واتە کتێبەکــانی ســەلەف ) وە ئەگەر

راســـتگۆیانت دەوێـــت ، ئەوا لەنـــاو خـــانوە کۆنەکانـــدا دەســـتت دەکەوێـــت ، دەست بگرن بە کۆنەکانەوە … دەست بگرن بە کۆنەکانەوە .!

| معجم السفر للسلفي |

“زانستەکەت سودی نابێت گەر کاری پێ نەکەی !"

17- أبو الدرداء - الله لێی رازیبێت - دەفەرمووێت :

نابیت بەزانا هەتا کار بەزانستەکەت نەکەیت .

| الجامع لكتب الإمام الآجري |

18- نێـــردراوی الـــلە ﷺ دەفەرمووێـــت : هەر کەســـێك چـــاکەیەك نیشـــانی خەڵك بداتئەوا وەکو ئەوەی کە ئەنجامی دەدات  پاداشتی پێ دەبرێت

| صحيح مسلم |

19- پێشەوا أحمد بن حنبل رحمـــە اللـــە -  دەفەرموێـــت : فێربـــوونی زانســـت و فێرکردنی خەڵکی ، باشترە لە جیهاد و لە جگە لەویش .

| الفروع |

20- پێشەوا الشافعي - رحمه اللــه - دەفەرمووێــت : زانســت دوو جــۆرە ، زانستی دین و زانستی دونیا ، جا زانستی دیــن بــریتیە لە زانســتی فیقهــــ و زانستی دونیاش بریتیە لە زانستی پزیشکی .

| آداب الشافعي ومناقبه لإبن أبي حاتم |

21- پێشەوا الأوزاعي - رحمــه اللــه - دەفەرمووێــت : پێویســتە لەســەرت شوێن ئاثاری سەلەف بکەویت ئەگەرچــی خەڵکــیش تۆیــان نەوێــت و رەتــت بــکەنەوە ، وە ئاگــاداربەو دووربــکەوە لە رەئــی و بۆچــوونی خەڵکــی ، ئەگەرچی بەقسەی جوان بۆتی برازێننەوە ...

| الشريعة للإمام الآجري |

22- پێشەوا الشافعي - رحمه الله - دەفەرمووێت :

فێربوونی زانست ، باشترە لە نوێژی سوننەت .

| آداب الشافعي ومناقبه لإبن أبي حاتم |

23- پێشەوا الشافعي - رحمه الله - دەفەرمووێت :

فێربوونی زانست ، باشترە لە نوێژی سوننەت .

| آداب الشافعي ومناقبه لإبن أبي حاتم |

خۆتان بپارێزن لە ناوبانگ و بەناوبانگ بوون !

24- پێشەوا الشافعي - رحمــه اللــه - دەفەرمووێــت : ئــاواتەخواز بــووم هەموو خەڵکــی لەمــنەوە زانســتیان وەربگرتبــاو کەســیش ئەو زانســت و زانیاریانەی نەدایەتەوە پاڵ من و باسی منی بەهیچ جۆرێك نەکردبا !

| صفة الصفوة |

25- پێشەوا أحمــد بــن حنبــل - رحمــه اللــه - دەفەرمــوێ : بە خشــوعی ئەهلی بیدەع و سەر نزم کــردن و خــۆ زەلیــل کــردن و ملکەچیــان و زۆری زانســت و لەبەرکراوەکانیــان فریــونەدرێن ، وە هــیچ رێــزو شکۆیەکیشــیان نییە .

| طبقات الحنابلة |

26- پێشەوا إبــن عيينــة - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : ئەو زانایــانەی کە لەئیســلامدا ناوبانگیــان دەرکــردووەو ناســراون ، نەناســراون و بەناوبانــگ نەبوون تا ئەوکاتەی کە پێیان ناخۆش بووە بناسرێن !

| صفة الصفوة |

27- پێشــەوا إبــن ســيرين - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : بەراســتی ئەم زانستە ( زانستی شەرعی ) دینە ، جــا بــۆیە بــروانن و بــزانن کە دینەکەتــان لە کێ وەردەگرن ؟!

| صحيح مسلم |

28- پێشـــەوای بـــاوەرداران و نـــوێکەرەوەی دیـــن عـــومەری کـــوری عبدالعزیز - رحمه الله - دەفەرموێــت : هەر کەســێك دینــداری خــۆی بــۆ مشتو مــرو بەربەرەکــانێ تەرخــان بکــات ، ئەوا زۆرو زوو زوو رێبــازەکەی دەگۆرێت !

| سنن الدارمي |

29- پێشـــەوا مالـــك - رحمـــە اللـــە - دەفەرمووێـــت : ســـوننەت وەکـــو کەشــتیەکەی نــوح ﷺ وایە ، هەر کەســێك ســەر بکەوێــت ( واتە ســوننەت پەیـــرەو بکـــات ) دەربـــازی دەبێـــت ، وە ئەوەی پـــێچەوانەی ئەوە بکـــات ، ئەوا تێدا دەچێت و نقوم دەبێت .

| ذم الكلام للهروي |

30- الله ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ ۗ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ( سورة النمل | 59 )

واتە : بڵێ : سوپاس و ستایش بۆ الله ، وە ســڵاو لــەو بــە ندانــەش بێــت کە هەڵیبژاردوون ...

پێشـــەوا ســـوفیانی ثەوری - رحمـــە اللـــە - لە تەفســـیری ئەو بەنـــدە هەڵبژێردراوانەی کە اللــە باســیان دەکــات لەم ئــایەتە پیــرۆزەدا ئەڵــێ : ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ .

| تفسير الطبري |

-31 پێشــــەوا أبـــو عبيـــد - رحمـــه اللـــه - دەفەرمووێـــت : هـــاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەسـێك شـارەزاترن بە لێکـدانەوەی واتـاو مەبەستەکانی قورئـان ، وە لە پـێش هەمـوو کەسیشـەوەن بـۆ ئەوەی شوێنیان بکەوین.

[ واتە : بـۆ تێگەیشـتن لە قورئـان سـوننەت ئەبـێ یەکەمجـار بگەڕێیـنەوە بـۆ تێگەیشتنی هاوەڵان]

| كتاب الأموالم |

-32 پێشـەوا أحمـد - رحمـه اللـه - دەفەرمووێـت : ڕەحمەتـی خـوا لەو بەنـدەیە بێـت کە حەق ئەڵـێ ، وە شـوێن ئەثەر دەکەوێـت و دەسـت دەگرێت بە سوننەتەوە ، وە شوێن چاکەکاران دەکەوێت .

| طبقات الحنابلة |

-33 لە ئامۆژگاریەکـانی پێشـەوا سـوفیانی ثەوری بـۆ پێشـەوا عبداللـه ـی موبـارەك - رحمهمـا اللـه - زانسـتەکەت بـڵاو بـکەرەوەو دووربە لە خۆدەرخستن و بەناوبانگ بوون !.

| حلية الاولياء |

" بگەرێنەوە بۆ کتێبەکانی زانایــانی ســەلەف بــۆ فێربــوونی ( زانســتی شــەرعی ) دینەکەتان"

33- پرسیار کرا لە پێشەوا ئەبــو داود - رحمــە اللــە - ووتیــان : فیتــنە زۆر بووەو ئەهلی بدعـــیش زۆرن ، وەســێتت ( ئامۆژگاریــت ) چــیە بــۆ ئــێمە ؟ لەدوای تۆ لای کــێ دانیشــین بــۆ فێربــوونی عــیلم ؟ فەرمــووی : لای کتێب دابنیشن .!

| الفوائد المنتخبة |

34- پێشــەوا الشــافعي - رحمــە اللــە - دەفەرمووێــت : دەرد و بەڵای زانســت بــریتییە لە : بێزاربــوون وەم کەمــی یــەم ئــارامگرتن لە وانەکــان و سەیر کردنیان .

| جزء فیە حکایات عن الشافعي للاجري |

"تەنانەت لە پێش حەجـــیشەوەیە .!!"

35- عبداللە ــی کــوری پێشــەوا أحمــد - رحمهمــا اللــە - دەفەرموێــت : پرســیارم لە بــاوکم کــرد دەربــارەی پیاوێــك کە 500 درهەمــی هەیەو لەهەمانکاتدا ئەو پیاوە پیــاوێکی نەزانە ، جــا ئایــا حەج بکــات بەو پــارەیە ؟ یاخود داوای فێربوونی زانستی شەرعی پێ بکات ؟

پێشەوا أحمد بن حنبــل - رحمــە اللــە - فەرمــووی : حەجــی پــێ ناکــات ، چونکە حەج واجبە ، وە داواکردنــی فەرمــوودەش هەر لەســەری واجــبە ، جا پێویستە لەسەری کە داوای زانســتی پــێ بکــا . [ پێشــەوا أحمــد - رحمــە

اللـــه - بـــۆیه وای فەرمـــوو : چـــونكه فێربـــوونی زانســـت پـــێش ووتەو كـــردەوەیه ، كەسێك زانستی بە شتێك نەبێت چـــۆن بتـــوانێ كـــاری پـــێ بكـــات ؟! بێگومـــان روونه كه ناتوانێت ,, لێرەدا مەبەســـت لێـــی لە فێربـــوونی ئەو زانســـته شـــەرعیانەیه كه حـــوكمی فێربوونیـــان فەرزی عەیـــنه ( واته مەبەســـتی ئەو زانســـتانەیه كه بەبـــێ فێربوونیـــان ناتوانیت دینداریەكەت بەشـــێوەیەكی دروســـت بكەیـــت ) ، مەبەســـت لێـــی لە فێربـــوونی ئەو زانسته شەرعیانه نییه كه فێربوونیان فەرزی كیفایەیه ,, ]

| مسائل الإمام أحمد لإبنه عبدالله بن أحمد |

36- پێشەوا الآجري - رحمه اللـــه - دەفەرموێـــت : نیشـــانەی كەســـی نەزان بریتییە لە : مشتوومڕ و قسەی بـــێ ســـوود و هەوڵـــدان بـــۆ ســـەركەوتن ، پەنـــا دەگـــرین بە اللـــه لە كەســـێك كه ئەمە مەبەســـتیەتی ، وە نیشـــانەی كەسێكی زانای ژیـــر بـــریتییە لە : ئامۆژگـــاری كـــردن لە گفتوگۆكانیـــدا ، وە سوودی بۆخۆی و بۆ كەسانی تـــریش بوێـــت ، اللـــه نمـــوونەی ئەم جـــۆرە كەسە زیاد بكات لەناو زانایانـــدا ، وە ســـوودی پـــێ بگەیەنێـــت بەزانســـت و جوانی بكات و بیرازێنێتەوە بەدانایی .

| الجامع لكتب الإمام الآجري |

37- پێشەوا الآجري - رحمـــه اللـــه - دەفەرمووێـــت : خـــۆت ســـەرقاڵ مەكە بەزانســـتێكەوە كە نەزانینـــی زیانـــت لـــێ نـــادات ، وە بـــێ ئاگـــا مەبە لە زانستێك كە بە واز لـــێ هێنـــانی لە نەزانیـــت زیـــاد بكـــات ، چـــونكه زانســـت هەیە ئارامی بە جەســـتەت دەدات و پاداشـــتی پـــێ بەدەســـت دەهێنیـــت ،

وە زانســـتیش هەیە کە ئـــازار و زیـــان بە لاشـــەت دەگەیەنێـــت و سزاشـــت بەهۆیەوە زیاد دەکات .!

| فرض طلب العلم لإمام الآجري |

38- هلال ــی کـــوری عـــلاء الرقـــي - رحمــە اللـــە - ئەڵـــێ : الـــلە تعـــالی منەتـــی بەســـەر ئەم ئـــوممەتەدا کـــردووە بە چـــوار کەس ، ( یەکەم ) بە الشـــافعي بە تێگەیشـــتنی لە فەرموودەکـــانی پێغەمـــبەری خـــوا ﷺ ، وە ( دووەم ) بە أبـــي عبیـــد کە راڤەو تەفســـیری فەرمـــوودە نامۆکـــانی پێغەمـــبەری کـــرد ﷺ ، وە ( ســـێیەم ) بە یحیـــی کـــوری معـــین کە درۆی نەهێشت لەنـــاو فەرموودەکـــانی پێغەمـــبەری خـــوا ﷺ ، وە ( چـــوارەم ) بە احمـــدی کـــوری حنبـــل کە بە فەرمـــانی پێغەمـــبەری خـــوا ﷺ جێگیـــرو دامەزراو بوو لەکاتی بەڵاو تاقیکردنەوەکەدا .

| معرفة علوم الحديث |

" لە ئامۆژگاریەکانی پێشەوا سوفیانی ثەوری "

39- پێشـــەوا ثەوری - رحمـــە اللـــە - دەفەرموێـــت : ئەو کەســـەی کە لەگەڵیدا دادەنیشـــیت بـــا کەســـێك بێـــت فێـــرت بکـــات و بەهـــۆیەوە دوور بکەویتەوە لە دونیـــاو وات لـــێ بکـــات تـــامەزرۆی قیـــامەت بیـــت ، نەکەی هەرگیز لەگەڵ ئەهلی دونیا دابنیشیت ،

ئەوانەی کە لە باسی دونیـــادا نـــوقم دەبـــن ، چـــونکە ئەوانە دیـــن و دڵـــت تێـــك دەدەن و خراپـــی دەکەن ، وە زۆر یـــادی مـــردن بـــکە و زۆر (

اســتغفرالله ) بــکە لەو تاوانــانەی کە کــردووتن ، وە داوای ســەلامەتی لە الله بکە دەربارەی ئەو تەمەنەی کە ماوتە .

| حلية الأولياء |

40- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾

(سورة آل عمران | 102 )

واتە : لە الله بترســن و پارێزکــار بــن ، بەشــێوەیەك کە شایســتەیەتی ، وە مەمرن بەموسڵمانی نەبێ .

عبداللــە ی کــوڕی عەبــاس اللــە لێیــان ڕازیبــێ دەفەرمــووێ : کــاتێ پێغەمــبەر ﷺ ئەم ئــایەتەی خوێنــدەوە فەرمــووی : ئەگەر قەتــرەیەك لە زەقوم ( زەقوم خۆراکی دۆزەخیەکــانە ) بکــرێتە نــاو دەریاکــانی دونیــا ، ئەوا ژیانی هەموو خەڵکی دونیا تێك دەدات !! ، جــا دەبــێ حــاڵی کەســێك چۆن بێت کە ئەوە خۆراکیەتی ؟!!

| مسند أبي داود الطيالسي |

41- پێشەوا الشافعي - رحمــە اللــە - دەفەرمووێــت : کاتێــك کەســێك لە ئەهلی هەواو ئارەزوو دەهات بــۆ لای مالــك ( بــۆ مشــتومر و گفتوگــۆی بێ سوود ) ، ئەویــش دەیفەرمــوو : مــن بەبەرچــاو ڕۆشــنیەوە دینــداری دەکەم ، بەڵام تــۆ گومانــت هەیە ( لە ڕاســتیەتی ڕێبــازو بیروبــاوەڕو

دینداری کردنت ) ، جا برۆ بــۆ لای کەســێك کە وەکــو تــۆ گومــانی هەیەو مشتومر لەگەڵ ئەودا بکە .

| سير أعلام النبلاء |

42- پێشەوا الآجــري - رحمــه اللــه - دەفەرمووێــت : فەرمانمــان پێکــراوە کە دەست بگــرین بەوەی کە لە پێغەمــبەری خــواوە ﷺ و هاوەڵەکــانیەوە هــاتووە ( اللــه لێیــان رازیبێــت ) ، وە ئەوانەی کە شــوێنیان کەوتــوون بەچــاکە ، وە ووتەی پێشــەوایانی مســوڵمانان نمــوونەی : مالــك ـــــی کــوری ئەنەس و ئەوزاعــی و ســوفیانی ثەوری و عبداللــه ـــــی کــوری موبارەك و هاوشــێوەکانیان ، وە شــافیعی و ئەحــمەدی کــوری حەنــبەل و قاسم ـــــی کــوری ســەلام ، وە هەر کەســێك کە لەســەر ڕێگــای ئەو زانایانە بێت الله لێیان رازیبێ .

| الشريعة للإمام الآجري |

43- منصوری حافظ بە تــابعی بەرێــز إبــراهیم النخعــي - رحمهمــا اللــه - فەرمووی : فەرمانــت بە کــچەکەت کــرد بەچــی ؟ ( واتە دەربــارەی نــوێژە سوننەتەکان )

إبراهیم النخعي فەرمــووی : فەرمــانم پێــی کــرد بە دوو ڕکــات لەدوای نوێژی عشاء ( خەوتنان ) . ئەمە لەکاتێکدا کچەکەی 5 یان 6 ساڵان بوو !

| مسند مسدد كما في المطالب العالية |

44- هـــاوەڵی بەرێـــز پێشـــەوا عبداللـــە ـــــی کـــوری مەســـعود وای پەروەردگـــار لێـــی رازیبێـــت دەفەرموویّـــت : شـــوێنکەوتوو بـــن و داهێنـــان مەکەن ( لە دیندا ) ، جا بەراســـتی ئەوەنـــدە بەســـە بـــۆ ئێـــوە ، وە ( بـــزانن کە ) هەموو داهێنراوێك گومراییە .

[ جا بەراستی ئەوەندە بەسە بۆ ئێـــوە ، واتە ئەوەنـــدە ئامۆژگـــاریە بەســـە بـــۆ ئـــێمە کە لە قیامەت سەرفراز بـــین ، ئەویـــش ئەوەیە کە : شـــوێن تێگەیشـــتنی هـــاوەڵان بکەویـــن بۆ تێگەیشتن لە قورئان و ســـوننەت ، وە ئەوەی لەوانەوە هـــاتوە کـــاری پـــێ بکەیـــن و ئەوان چـــۆن دینـــداریان کـــردووە ئـــێمەش بەو شـــێوەیە دینـــداری بکەیـــن و شـــتی تـــر دانەهێنین لە دیندا ]

| الزهد للإمام وكيع بن الجراح |

❞ مەلاو شێخە کافرو گومراکان بناسێنن ❝

45- پێشـــەوا البربهـــاري - رحمـــە اللـــە - دەفەرموویّـــت : ئەگەر کەســـێکت بینـــی دانیشـــتووە لەگەڵ کەســـێك لە گومراکـــان ، ئەوا ئاگـــاداری بـــکەوەو پێی بناسێنە ( کە ئەو کەسە گـــومرایە ) ، جـــا ئەگەر هەر لەگەڵـــی دانیشـــت دوای ئەوەی زانی و تێگەیشت ، ئەوا ( بزانە کە ) ئەویش گومرایە .

| شرح السنة |

"دووربە لەم جۆرە کەسانەو هاورێکانیشیان !"

46- پێشـــەوا الشـــافعي - رحمـــە اللـــە - دەفەرموێـــت : هەر کەســـێك زانستی خۆشنەوێت خێری تێدا نییە ، بـــا لەنێـــوان تـــۆو ئەودا یەکتـــر ناســـین و هاورێیەتی نەبێت .

| مناقب الشافعي للبيهقي |

47- زانای بەرێـــز قتيبـــة - رحمـــە اللـــە - دەفەرموێـــت : ســـوفیانی ثەوری مرد و لەگەڵیشیدا وەرع مرد ، وە شافعی مـــرد و لەگەڵیـــدا ســـونەت مـــرد ، وە أحمد بن حنبل دەمرێت و بیدعە دەردەکەوێ !

| البداية والنهاية |

48- پێشەوا إبن سيرين - رحمە اللە - دەفەرموێ :

ئەگەر بەندە شوێنکەوتووی ئەثەر بێت ، ئەوا لەسەر رێگا راستەکەیە ...

| الشريعة للإمام الآجري |

49- پێشەوا الآجـــري - رحمـــە اللـــە - دەفەرمووێـــت : هەر کەســـێك پێـــی خۆشـــە بگـــات بە پـــلەی نامۆکـــان ، ئەوا بـــا ئـــارام بگرێـــت لەســـەر ئەو ئەزیەتانەی کە بەهۆی دایـــك و بـــاوکی و هاوســـەرەکەی و بـــرا کـــانی و خزمە نزیکەکانیەوە توشی دەبێت .

| الغرباء للإمام الآجري |

"برایەتی و خۆشەویستی لە پێناو الله ﷻ"

50- پێشــەوا الفضــیل - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : گەیشــتم بە بــاوکی ئسحاق دوای ئەوەی کە بینــایی لەدەســتدا بــوو ، جــا گــرتمیە بــاوەش و منــیش ووتــم : دەمناســی ؟ ووتــی : بەڵــێ ، ســوێند بە اللــه مــن دەتناسمەوە ، وە مــن خۆشــم دەوێیــت ، گەر شــەرم نەبــوایە ماچیشــم دەکردیت ، دەزانی ئەم ئایەتە لە بارەی چیــیەوە دابەزیــوە ؟ أبــو الأحــوص پێــی راگە یانــدم کە عبداللــه کــوری مســعود - اللــه لێــی رازیبێــت - فەرمــوویەتی : دەربــارەی ئەوانە دابەزیــوە کە لەپێنــاو اللــه یەکتریــان خۆش دەوێت : لو أنفقت مــا فــي الأرض جميعــا مــا ألفــت بــين قلــوبهم ولكن الله ألف بينهم ( 63 ) الأنفال

| الإخوان لابن أبي الدنيا |

51- پێشەوا إبن المبارك - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : نەمزانیــوە لە دوای پێغەمبەرایەتیــەوە پــلەیەك هەبێــت کە باشــتر بێــت لە بڵاوکــردنەوەی زانست .

[ مەبەستی لە بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعیە ]

|تهذيب الكمال|

52- پێشەوا إبن عباس - اللــه لە خــۆی و بــاوکی رازیبێــت - دەفەرموێــت : بەراستی ئەوکەسەی کە چــاکە فێــری خەڵــك دەکــات هەمــوو ئاژەڵێــك

داوای لێخۆشـــبونی بـــۆ دەكەن ، تەنـــانەت حـــوتیش لەدەریـــادا ( داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكات ) !

|العلم لإبن حرب|

53- پێشەوا البربهــاري - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : بـــروانە رەحمەتــی خــوات لێبێــت ، گەر گوێــت لە قســەی هەر كەســێك بـــوو بەتــایبەتی لەو ســـەردەمەی كە تـــۆی تێـــدای ، ئەوا پەلە مەكەو مەچـــۆرە نـــاو هـــیچ بابەتێكەوە ، هەتا پرســیار نەكەیــت و ســەیر نەكەیــت كە ئایــا هــاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیان دەربارەی كــردووە ؟ یــان یەكێــك لە زانایــان ؟ جــا ئەگەر لەوانەوە ئەثەرێكــت دەســتكەوت ، ئەوا دەســتی پێــوە بگـــرەو وازی لێ مەهێنە بۆ هیچ شتێك ، وە هــیچ شــتێك ســەر مەخە بەســەریدا ، كە بەهۆیەوە بكەویتە ناو ئاگرەوە .

|شرح السنة|

54- پێشەوا الشعبي - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : ئەوەی لە هــاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ هــاتووە دەســتی پێــوە بگـــرن ، وە ئەوانەی كە تێیــدا بە رەئی و بۆچوونی خۆیان دەدوێن ئەوا میزی پێدا بكە .

أبو عمر دەڵێــت : مەبەســتی لە رەئــی و بۆچــونێكە كە پــێچەوانەی ئاثــار بێت . [ ئەوانەی كە تێیــدا بە رەئــی و بۆچــوونی خۆیــان ... واتە ئەوانەی كە لە دینــدا بە رەئی و بۆچوونی خۆیان ... تا كۆتایی ووتەكەی - رحمه الله ]

|المصنف للصنعاني ، كتاب الجامع|

"لاسایی هاوەڵان بکەوە لە دینداری کردنتدا "

55- پێشــەوا البربهــاري - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : بــزانە رەحمەتــی خوات لێبێت ، ئەهلــی عــیلم هەرگیــز نەوەســتاون لە رەددانەوەی ووتەی جەهمیەکان ، هەتا لە ســەردەمی خلافەتــی عەبباســیەکان رووبضــة هــات و قســـەی کـــرد لە کاروبـــاری گشـــتیدا ، تانەیانـــدا لە فەرموودەکـــانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، شوێن قیــاس و بۆچــوون کەوتــن ، وە ئەوانەشــیان بە کــافر دادەنــا کە پێچەوانەیــان بــوون ، جــا خەڵکــی نەزان و بــێ ئاگــاش ، لەوانەی کە زانستیان لەلا نییە شــوێن قســەی ئەوان کەوتــن ، تــاکو کــافر بــوونەوە بە شــێوەیەك کە نەیانــدەزانی و بــێ ئاگــا بــوون لێــی ، جــا ئـــوممەت بە هەلاکەتـــدا چـــوو لە چەنـــد روویەکەوە ، وە لە چەنـــد روویەکەوە توشــی کــوفر بــوو ، وە توشــی زەنــدەقە بــوو لە چەنــد روویەکەوەو لە چەنـــد روویەکیشـــەوە گـــومرا بـــوو ، وە لە چەنـــد روویەکیشەوە توشــی تەفــرەقەو جیــایی و بیــدعە بــوون ، ئــیللا ئەوانە نەبێ کە جێگیرو دامەزراو بوون لەســەر فەرمایشــتی پێغەمــبەری خــوا ﷺ و فەرمانەکانی و فەرمانی هاوەڵەکانی ( رضــي اللــه عــنهم ) ، قســەیان پێش هــیچ یەکێــك لەوان نەخســت و لە فەرمانیــان دەرنەچــوون ، وە هەر ئەوەی بەس بوو کە ئەوان ووتیــان ، پشــتی هەڵنەکــرد لە رێگــاو رێبــازی ئەوان ، وە دەیزانـــی کە ئەوان لەســـەر ئیســـلام و بـــاوەرێکی راســـت و دروســـتن ، بـــۆیە لە دینداریکردنیـــدا بە ئاســـودەییەوە تەقلیـــدی ئەوانـــی

کردەوە ، وە زانــی کە دیــن بــریتییە لە تەقلیــدو لاســاییکردنەوە ، ( بەڵام تەقلیدی کێ ؟!! ) تەقلیدی هاوەڵانی محمد ﷺ .

|شرح السنة|

"پێچەوانەی ڕێبازی هاوەڵان مەکە "

-56 پێشەوا الشافعي - رحمــە اللــە – دەربــارەی یەکێــك لە بنچینەکــانی مەزهەب لە وەڵامــی ئەهلــی ڕەئیــدا دەفەرموویــت : ئــێمە پــێچەوانەی هیچ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نــاکەین ، ئــیللا پــێچەوانەی کەســێك دەکەین کە ( لەسەر ڕێبازی ) جگە لەوان بێت .

|کتاب الأم|

-57 پێشەوا البربهــاري - رحمــە اللــە - دەفەرموێــت : وە ئەو بنەمــایەی کە جەماعەتـــــــی لەســــــەر دامەزراوە : هــــــاوەڵانی محمدـــــــــن ﷺ ، ڕەحمەتــی اللــە لە هەموویــان بێــت ، وە ئەوان ئەهلــی ســـوننەت و جەماعەتـــن ، جا هەر کەسێك

لەوانەوە ( دیـــن ) وەرنەگرێـــــت ، ئەوا گـــــومرا بـــــووەو مــــوبتەدیعە ( داهێنانی کــردووە لە دینــدا ) ، وە هەمــوو بیــدعەیەکیش ( داهێنــانێکیش لە دیندا ) گومراییە ، وە گومرایی و ئەهلەکەی لە ئاگردان .

| شرح السنة |

58- پێشەوا البربهاري - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : وە بــزانە رەحمەتــی خوات لێبێــت ، کە بەراســتی ئەم دیــنە لەلایەن اللــه تبــارك وتعالی.ـــوە هـــــاتووە ، لەســـــەر عەقــــڵ و بۆچــــونی مرۆڤەکـــــان دانەمەزراوەو زانســتەکەی لای اللــه و پێغەمبەرەکەیەتــی ﷺ ، جــا بــۆیە شــوێن هــیچ شتێك مەکەوە بە هەواو ئــارەزووی خــۆت ، کە پێــی دەربچیــت لە دیــن و بچیتە دەرەوەی ئیســلام ، چــونکە بەراســتی هــیچ ( بیــانوو ) بەڵگەیەکــت نیــیە ، لەبەرئەوەی پێغەمــبەری خــوا ﷺ ســونەتەکەی ( رێبــازەکەی ) روونکردۆتەوە بۆ ئــوممەتەکەی ، وە روونــی کــردۆتەوە بــۆ هــاوەڵانی ( اللــه لێیــان رازیبێــت ) ، وە ئەوانــیش ( هــاوەڵان ) جەمــاعەت و رەشــاییە گەورەکەن ( الســواد الاعظــم ، کە بــریتییە لە ) حەق و ئەهــلەکەی ، جــا ئەوەی لە شتێك لە کاروبــاری دینــدا پــێچەوانەی هــاوەڵانی پێغەمــبەری خوا ﷺ بکات ، ئەوا کافرە .

| شرح السنة |

“بیانوو بە نەزانین بۆ هــیچ کەســێك نیــیە ئەوەی لەســەر خەڵکــیە تەنهــا شوێنکەوتنە “

59- پێشــەوا البربهــاري - رحمــه اللــه - دەفەرموێــت : عمر.ـــی کــوری الخطاب - رەحمەتی خــوای لێبــێ - فەرمــوویەتی : عــوزر ( بیــانوو ) بــۆ هیچ کەسێك نییە کە لەســەر گــومرایی بێــت و وابزانــێ ئەوە هیــدایەتە ( رێگای راستە ) ، وە یان واز لە هیدایەت بهێنــێ و پێــی وابێــت گــومراییە ، چونکە هەموو شتێك ( دەربارەی کاروباری دین )

ڕوونکراوەتەوە ، وە بەڵگەش جێگیر بووە ،

وە عوزریش ( بیانوو بە نەزانین ، عــذر بالجهــل ) نەمــاوە . پاشــان پێشــەوا البربهاري دەفەرموێت :

ئەهلی سوننەو جەماعەت هەمــوو کاروبارەکــانی دینیــان ڕوونکــردۆتەوە ، وە بۆ خەڵکیش ڕوونکــراوەتەوە ، جــا لەســەر خەڵکــی ئەوەیە کە شــوێنی بکەون .

| شرح السنة|

60- زانــای بەرێــز شــریح - رحمــە اللــە - دەفەرمووێــت : شــوێنکەوتەبە ( واتە شــــوێن ئاثـــار بــــکەوە ) ، وە داهێنــــان مەکە ( لە دینــــدا ) ، چــــونکە بەراستی تۆ گومرا نابیت گەر دەست بگریت بە ئەثەرەوە .

| سنن الدارمي |

61- إسماعيل الأصبهاني (535)هــــ ئەڵــێ: ئەهلــی ســوننە ئەڵــێن زانســت بەزۆری ڕیــــوایەت نییــــە، بەڵکــــو زانســــت بەشــــوێنکەوتن و بەکــــار هێنانیەتی،شــوێنی هــاوەڵان وتــابعین بکەوێــت ئەگەر چــی زانستیشــی کەم بێــت ،هەرکەســێك پــێچەوانەی هــاوەڵان و تــابعین بکــات ئەوە گومڕایە ئەگەر چی زانستیشی زۆربێت.

| الحجة في بيان المحجة 3/504 |

62- بە ایوب وترا: ئایا ئەمڕۆ زانست کەمە یان زۆر؟

ووتی: ئەمرۆ قسە زۆرە، پێش ئەمڕۆ عیلم زیاتربوو.

| المعرفة والتاريخ 2 / 232 |

63- ئیمــامی الآجــري ئەڵێــت : ئیمانــداری عاقــڵ هەرگیــز دەســتبەرداری بەدەستهێنانی زانست نابێت هەتا لە ژیاندا بێت.

| فرض طلب العلم |

"بۆچی زانست فێربین ؟"

64- تابعي تابعين ســفيان الثــوري دەفەرمــوێ: ﴿إِنَّمَـا يُـتَعَلَّمُ الْعِلْـمُ لِيُتَّقَى اللَّهُ بِهِ﴾

فێــری زانســت ئەبــین بــۆ ئەوەی لە پەروەردگــار بترســین و تەقــوای پەروەردگار بکەین.

| جامع بيان العلم 1159 |

65- پێشەوا شەعبی ئەفەرموێت : (( يا طلاب العلم، لا تطلبوا العلم بسفاهة وطيش، اطلبوه بسكينة ووقار وتؤدة)).

واتە : ئەی زانست خوازان، داوای زانست مەکەن بە گێلاتی و نەزانی، داوای زانست بکەن بە ئارامی و لەسەرخۆیی

[ پەلەکردن لە وەرگرتنی زانستی شەرعی، هۆکارێکە بۆ بەدەست نەهێنانی زانست، چونکە ئەو زانستەی  بە پەلە وەرئەگیرێت، هەر بە پەڵەش لە خاوەنەکەی ئەڕوات و بیری ئەچێتەوە]

| روضة العقلاء   57 |

"زانستی زانا کافر و گومراکان فریوتان نەدات !"

66- پێشەوا أحمـــد بـــن حنبـــل - رحمـــە اللـــە - دەفەرمـــوێ : بە خشـــوعی ئەهلی بیدەع و سەر نزم کـــردن و خـــۆ زەلیـــل کـــردن و ملکەچیـــان و زۆری زانســـت و لەبەرکراوەکانیـــان فریـــونەدرێن ، وە هـــیچ ڕێـــزو شکۆیەکیشـــیان نییە .

| طبقات الحنابلة |

67- تابعي تابعين سفيان بـــن عيينـــة  رحمـــە اللـــە دەفەرمووێـــت : ئەزانـــن نمونەی زانســـت چـــیە، هاوشـــێوەی دار کفـــر و دار ئیســـلامە، گەر ئەهلـــی ئیسلام واز لە جیهاد بهێـــنن ئەوا ئەهلـــی کـــوفر دێـــن و ئیســـلام نـــاهێلن، وە گەر خەڵکی وازیان لە زانست هێنا ئەوا جاهیل و نەزان دەبن.

| تهذيب الكمال |

68- عبدالله بن مسعود رضــي اللــه عــنه› ووتــی : فێــربنن ، هەر کەســێك فێربوو با کردەوەی پێبکات.

| الجامع لابن وهب | 1370 |

69- الفضيل بن عيــاض ووتــی : بە بەردەوام کەســی زانــا جاهيــل و نەزانە بەوەيی فێربووە و زانيوويەتی هەتاکو کــردەوەی پــێ دەکــات جــا ئەگەر کردەوەی پێکرد ئينجا بۆتە کەسێکی زانا.“

|اقتضاء العلم العمل | 37 |

70- عبدالله بن المعتز ووتی : زانســت و علــم بەبــێ کــردەوە وەکــو داری بێ بەرەبوومە.

هەروەها ووتی : علمــی مونــافيق لە قســەکردنيتی ، وە علمــی بــاوەردار لە کردەوەيتی.

| اقتضاء العلم العمل | 38-37 |

71-عبدالله بن هبيرة ووتی : تۆ نابيتە عــالم هەتــاکو نەبيــتە فێرخــواز ، وە جوان نابيت بە علم هەتاکو بەوەيی کە زانيووتە کردەوەت کردووە.

| الجامع لابن وهب | 1281 |

72- مهنا دەڵــێ: بە احمــد بــن حنبــل -م ووت : باشــترین کــار و کــردەوە چییە؟

ووتی : هەوڵدان بــۆ وەرگرتنــی زانســت ( زانســتی شــەرعی )، بەڵام بــۆ کەسێك کە نیەتی خۆی پاك کردبێتەوە بۆ الله تعالی،

منیش ووتم : چ شتێك نیەت پاك و دروست دەکات ؟

ووتــی : بەفیــز نەبــێ و ســادە بــێ، جەهــل و نەزانــیش لە خــۆی دوورخاتەوە.

| طبقات الحنابلة لابن ابي يعلي 381/1 |

بــــــزانە دینەکەتــت لە کــــــێ وەردەگریتــت!!! رەحمەتــت لێبێــت بــۆ وەرگرتنی هەدیە علم وەرمەگرە..!!

73- ابــن منــدە دەڵێــت : فەرمــوودەم لە (١٧٠٠) شــێخەوە نوســیەوە، دووجار بە رۆژهەڵات و رۆژئاوا گەرام نزیــك نەبــوومەوە لە هــیچ کەســێك کە عەقیــــــــدەیی جێگیرنەبێــــــــت و لەرەلەری هەبێــــــــت، وە یەك فەرموودەشم لە هیچ بیدعەچییەکان نەبیست.

| طبقات الحنابلة (٢/١٦٧)|

والحمد لله رب العالمین